**بەشداربووان**

د. مارف خەزنەدار

مەسعوود محەمەد

قەڵەمکێش و تابلۆی سەر بەرگ:

قەرەنی جەمیل

---

**ژمارەکانی داهاتوو:**

ئەنوەر قادر محەمەد

پیربال مەحموود

مەم و زینی ئەحمەدی خانی

مەحوی


سەرپەرشتیاری گشتی: دڵشاد عەبدوڵڵا

ستافی ڕۆڤار: یاسین عومەر / سەباح ڕەنجدەر

دەرهێنەری هونەری: حەمید ئازمووده

ڕۆڤار : بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە/ هەر ژمارە تایبەتە بە داهێنەرێک

ناونیشان: هەولێر -شەقامی گوڵان-دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

سلێمانی -شەقامی سالم -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



ژمارەی تەلەفۆن سەرپەرشتیاری گشتی :

کۆرەک: ٠٧٥٠٤٥١٢٧٨٦ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٣٢١٤٥

Email:d.abdullah@araspress.com

# نالی

## خۆرێک هەمیشە بەسەر سەرمانەوە

### ژیان و بەرهەم

دڵشاد عەبدوڵڵا

**هەرچەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بوو**
**چونکە ئەمەلت زۆرە، چ عومرێکی کەمت بوو!**

پیرەمێرد لە پێشوازی دیوانی نالی ـ دا دەنووسێ: "تەقریبەن نەوەد ساڵ لەمەوپێش، ڕۆژێکی ڕەنگ زەردی پایز کە شینایی ئاسمان غوبارێکی کپیف دایپۆشیبوو، لە دەمەدەمی بەیانیدا پیرێکی سەر و ڕیش سپی ئیفتادە، مێزەر بە سەر، بە مات و مەلوولی، لە پشت ئەسپێکی بە کورتانەوە ڕوو بە (وەیس) لە سولەیمانی دەرچوو. لە دوایەوە غەیری چەند فەقێیەکی خانەقا نەبێت، تەشیع کەرێکی نەبوو....." پاشان دەنووسێ: "دڵی نالی قبووڵی مانەوەی نەکرد لە وڵاتەکەیدا". "مەردانە پێی نا بە دڵیا، خەیاڵی "حەبیبە"ی خستە ئەو لاوە، ڕوو بە مەجهولات، بە غوربەت سەری نایەوە". "بە ئارەزوو ئیختیاری خۆی تاجی (ملک الشعرا)یی لەسەر خۆی فڕێ داو نایە ژێر پێیەوە، چونکە لە نەزەر ئەودا موڵکی بێ تەخت و شاعیری بێ تاجی ئەویست".

مەلا خدر نالی، یان نالی ئەفەندی کوڕی ئەحمەد شاوەیسی مکایەڵیی جافە و نازناو یان تەخەلوسی شیعریی (نالی)یە. لە گوندی خاک و خۆڵی شارەزوور لە دایک بووە. سەبارەت بە زانیاریی لەبارەی باوکی شتێکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە و نەزانراوە کە مەلا بووە، یان وەرزێرێکی نەخوێندەوار، بەڵام دیارە خێزانێکی هەژاری بووە. دایکی نالیش نەناوی زانراوە نە دیاریشە لە چ خێزان و تیرە و عەشیرەتێکە، هێندە هەیە کە پێ دەچێ باوکی نالی زوو مردبێ و هەر تەنیا ئەو تاقانە کوڕەشی لەپاش بەجێ مابێ و دایکی ئەرکی بەخێوکردنی گرتۆتە ئەستۆ و هەر زوو خستوویەتییە بەر خوێندن.

بە گوێرەی ئەو سەرچاوە نووسراوانەی هەن کەمترین زانیین لەبارەی ساڵی لە دایک بوون و چۆنییەتی ژیان و نووسینی بەرهەمەکانی لەبەر دەستماندایە و ئەو کەمەی هەیە بەشی ئەوە ناکات بایۆگرافییەکی دروستی لێ بنووسرێتەوە. نالی کە گرنگترین شاعیری سەدەی نۆزدە و دامەزرێنەری ڕێنیسانسی ئەدەبی کوردی و داڕێژەری ناوەندی نوێی زمانی ئەدەبی یەککگرتووە بە ناوەڕۆک و فۆرمێکی تازە، کەچی ڕووداو و بەرهەمی ئەو نوێکەرەوە گرینگە تۆز و گەردی نەزانین و بزر بوون دایپۆشیوە. ئەگەرچی چەندین دەستنووس و بەیازی لە دوا بەجێ ماوە کە هاوزمانانی بە پچڕ پچڕی تۆماریان کردوون، هەر هەمووشیان جگە لەو دەقە شیعریانەی کە ژمارەیان لە نێوان ١٢٠- ١٣٠ دەق زیاتر نین و ناچێتە عەقڵی هیچ کەسێکەوە شاعیرێکی ئاوەها کە دۆست و غەیرەزمان شایەتی بلیمەتی و شکۆمەندیی و زانایی بۆ دەدەن، هەر هێندە بەرهەمەی هەبێ. خۆ ئەگەر هەوڵ و کۆششی کەسانی وەکی کوردی و مەریوانی و عەلی موقبیل و گیو موکریانی و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مارف خەزنەداریش نەبان، ئەوا بە شێکی زۆری ئەو دەستنووسانە دەفەوتان و کەس ئاوڕیانی لێ نەدەدایەوە. ئەوەی ئەوانیش کردوویانە تەمومژی لە دەوری ئەو شاعیرە کەم نەکردۆتەوە، بە پێچەوانەوەتەمومژەکە خەستتر و قووڵتر بووە. باپێکەوە بەشێک لەو لاپەڕانەی ژیان و بەرهەمەکانی هەڵدەینەوە و لەو شوێنانەی پێویستە تەمومژەکان دیاری بکەین.

نالی لە ساڵی ١٧٩٧، یان ١٨٠٠ی زاین، یان زووتر لە دایک بووە! محەممەد ئەمین زەکی بەگ ١٢١٥-١٢٧٣ی کۆچی بۆ داناوە کە دەکاتە ١٨٠٠-١٨٥٦ی زاین، هەرچی عەلادین سەججادییە ١٢١٧-١٢٧٥ی کۆچی بۆ داناوە کە دەکاتە ١٧٩٧-١٨٥٥ی زاین، د. مارف خەزنەدار ١٢٢٠-١٢٧٦ی داناوە و سدیق بۆرەکییش لە بەیازێکدا دۆزیویەتەوە کە ١٢١٢-١٢٩٥-ە، واتە نالی بەو حیسابانە ٥٨، یان ٥٦، یان ٨٣ ساڵ ژیاوە.

ساڵی کۆچی دوایی نالی بە گوێرەی دەستنووسێکی عوسمانی کە د. عەبدوڵڵا حەداد بڵاوی کردۆتەوە و لە کتێبی "نووسەرانی عوسمانلی - محەممەد تاهیر بورسەلی" وەرگیراوە ١٢٩٠ی کۆچی کە دەکاتە ١٨٧٢- ١٨٧٣ زاین لە حەج گەڕاوەتەوە ئەستەمبوول و دواتر لەوێ مردووە، کەوا بوو ١٨٧٣ی زاین بۆ کۆچی دواییەکەی ساغ بۆتەوە. ئەوەی زانراوە و هەیە تەمومژی سەر ژیانی نالی نەڕەواندۆتەوە، چونکە ئەو وەکی خۆرێک وایە هەرچەندی بتەوێ لێی نزیک بینەوە تیشک و گەرمای زۆری دوورت دەخاتەوە، نهێنی کەسانی وا میحوەری و موعجیزە وایە، ئەوان سیحر و ئەفسوون لە دەوری ڕووداوەکان دروست دەکەن و ئەنجام خۆشیان دەبنە لوغز، بۆیە ئاساییە ئێمەی دیدالۆس کە باڵمان لە شەمێیە کە دێن لەتەبەشی پڕ گڕ و ڕووناکی ئەو خۆرە نزیک دەبینەوە باڵمان دەتوێتەوە و لە هەزار بە هەزاری دۆڵی عاسێدا دەکەوینە خوار و لەو کەوتنە خوارەوەیەشدا مانا و جوانییەکی قووڵ و شیرین دەدۆزینەوە، ئەوان هەموو شتێکی ئەو بوونە لە بەهرەی خۆیاندا دەتاڵێنن، کە دەستیان لێ دەدەین بۆن و بەرامەی ئەوانی پێوەیە.

ماوەی زیاتر لە مانگێکە سەر لەنوێ دیوان و ئەو کتێبانەم خوێندەوە کە لێرە و لەوێ شتێکیان لەبارەی ئەو شاعیرەوە نووسیوە، مەبەستیش دوو لایەنە بوو، یەکیان بۆ ئەوەی ژمارەیەکی "ڕۆڤار" بۆ نالی ئامادە بکەین و ئەوەی تر بۆ تیژکردنەوەی زاری شیعر و فێربوونی زمانێکی پوخت و پڕ سەلیقە لەو قوتابخانە شیعرییەدا، هەردووکیان بە پیت و فەڕ بوون.

وەکی پێشتر نووسیم نالی لە کۆتایی سەدەی هەژدە لە دایک بووە و هەر ئەوەش ڕێی تێ دەچێ، هەرچەندە ئەو سێ و چوار ساڵەی سەدەی هەژدە کارێکی ئەوتۆ ناکەنە سەر گشتی ڕووداوەکانی ژیانی ئەو شاعیرە، بەڵام هەر نەزانینی عەیبەیە بۆ میللەتێک کە ساڵی لە دایکبوون و کۆچی شاعیرێکی ئاوهای خۆی نەزانێ، تاکە پاساوێک کە هەبێ بۆ ئەو نەزانینە ژیانی پڕ لە نەهامەتی و بێ کیانی میللەتەکە خۆیەتی کە بۆتە مایەی هەموو جۆرە

دواکەوتنێک. ئەگەر نالی –یش لەناو نەتەوەیەکی خاوەن کیان و بەسەروبەر بوایە ئاوها نەدەبوو. ئێستا کە ئەو دێڕانە دەنووسم لەناخەوە گریانم بۆ ڕەمزێکی پایەداری نەفس بەرز دێ چۆن لەناو قەومی بەسیتدا بۆتە عەکسی قەمەر لەناو گۆمی لێخندا.

هەر لەگەڵ یەکەم چاپی دیوانی نالی ـ دا لە ساڵی ١٩٣١ لە لایەن کوردی و مەریوانییەوە لە بەغدا بڕێک زانیاریی لە بارەی ساڵی هاتنە دنیا و حەبیبە و شتی تر تۆمار کراون و دواتریش لە چەند شوێنێکدا دووبارە کراونەتەوە، بەبێ ئەوەی سەرچاوە و بناوانی دیار کرابن. بۆ نموونە لەم دیوانەدا ساڵی هاتنە دنیای شاعیر بە ١٢١٥ی کۆچی و بەرانبەرەکەی ١٧٩٧ە زاین – دیاریکراوە (ڕۆژ و مانگ دیار نین)، عەلی موقبیل و عەلادین سەججادی هەمان ساڵیان دووبارە کردۆتەوە. کەچی د. مارف خەزنەدار لە بەرانبەر ئەو ساڵەی کۆچی بە گوێرەی جەدوەلی ئۆربێلی ئەرمەنی کردوویەتیە ١٨٠٠ی زاین.

ئێمە لەم بایۆگرافییەدا پشت بە ١٧٩٧ی زاین دەبەستین، کە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ساڵی لە دنیا دەرچوونی شاعیر کە ١٨٧٣ـ یە، دەردەکەوێ نالی ٧٦ ساڵێک ژیابێ، پێم وایە هێشتا گومان لە ١٧٩٧یش هەیە بە گوێرەی ئەوەی د. سدیق بۆرەکەیی لە بەیازێکدا دیوویەتی، یان ئەو قسەی مەلا عەبدوڵڵا جەلیزادەی باپیری مەسعوود محەممەد کە ساڵی ١٨٧١– ١٨٧٢ نالی لە مەککە دیوە کە زۆر پیر بووە، لە شوێنێکی تریشدا وتراوە،کە نزیکەی هەشتا ساڵێک بووە. بەهەرحاڵ ١٧٩٧ یان چەند ساڵێک زووتریش گونجاوترە لەگەڵ ئەو قسانەی سەرەوە.

نالی لە سەرەتای تەمەنی منداڵی تا دەوروبەری هەشت نۆ ساڵی هەر لە خاک و خۆڵ ماوەتەوە و لەوێ خراوەتە بەر خوێندن، چونکە لە شیعرەکانیدا هەروەکو هەریەک لە د. مارف خەزنەدار و مەسعوود محەممەد بۆی چوون، ئەو خۆشەویستی و سۆزەی کە لە شیعرەکانیدا دیارن لە بەرانبەر زێد و مەڵبەندی لە دایکبوون و منداڵی گەواهی بۆ ئەوە دەدەن کە شاعیر پێ دەچێ تا ساڵی ١٨٠٧–١٨٠٨ نەچووبێتە شار و پەیوەندی بە شارستانەوە نەبووبێ.

پاش خاک و خۆڵ بۆ خوێندن چۆتە قەرەداخ و لەوێ لەتەک خوێندنی قورئان زمانی فارسی و عەرەبیشی خوێندووە. قەرەداخ مەڵبەندێکی گرینگی زانستەکانی ئیسلام و زمانی عەرەبی بووە و زانا و مەلای دیار و ناوداری لێ بووە. دواتر بۆ خوێندن چۆتە سلێمانی و لەلای مەلاکانی ئەوێ خوێندنی تەواو کردووە و لە مزگەوتی سەید حەسەن ژوورێکی وەرگرتووە و بۆتە مەلا و هاتووچۆی خانەقای مەولاناشی کردووە. کەچی لە دیوانی نالی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسدا هاتووە کە نالی ژووری لە خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندی هەبووە لەگەڕەکی (دەرگەزێن). بۆ خوێندن و بۆ مەلایەتی زۆر ناوچە و شوێنی کوردستان گەڕاوە لەوانە، زەردیاوای قەرەداخ، سنە، سابڵاخ، هەڵەبجە و ئینجا سلێمانی جێگیر بووە. بە پێی هەندێک گێڕانەوە چۆتە کۆیە بۆ خوێندن و هاتۆتە هەولێریش و لە خانەقاکەی ماوەیەک ماوەتەوە.

فەقێ تا دەبوو بە مەلا جگە لە قورئان دەبوو زانستەکانی نەحوو سەرف و ئینشا و عروز و تەسەوف و حقوق و اصولی فقه و تەفسیر و حیساب و چی و چی بخوێنێ، دیارە نالی – یش ئەو هەموو زانستانەی خوێندووە و شارەزاش بووە تێیاندا.

لە ژیان و ئەزموونی نالیدا چەند وێستگەیەکی گرینگ هەن، یەکێک لەوانە خۆشەویستی "حەبیبە"یە، کە کەس نازانێ ئەو ناوە خوازراوە، یان ڕاستەقینەیە، یان لە وشەی یار و دولبەرەوە وەرگیراوە، ئەوانە مەبەست نین، مەبەست ئەو خۆشەویستییە شێتانەیە کە هەناوی نالی هێناوەتە جۆش و جینانی وەک جینان کردووە بە مەئوا، حەبیبەی ماڵیاوا ماڵی ئاوا! ئەو ماڵیاوایەش مشتومڕێکی زۆری لەسەرە، چونکە ئاواییەک نییە لە ناوچەی قەرەداغ و شارەزوور بە ناوی ماڵیاوا. ئەو خۆشەویستییەی کە نەگەیشتۆتە هەتا سەرنانەوەی یەکجارەکی هەر لەگەڵیدا بووە، لە دڵ و دەروونیدا بووە.

وێستگەی تری ئەزموونی نالی دامەزراندن و نووسین بووە بە شێوەزاری سلێمانی و هەوڵی بۆ لێکۆڵینەوە لە دیالێکتەکانی کوردی و دواتریش بە پشتگیریی ئەحمەد پاشا پێ دەچێ ڕاو تەگبیرێک لە ئارادا بووبێ بۆ ناوەندێکی لەو شێوەیە کە ببێتە یەکێک لە ستوونەکانی پێکهێنانی کیانی نەتەوەیی.

پێشتر ئەدەبی کوردی بە شێوەزاری گۆران نووسراوە، نالی هەرچەندە خەڵکی شارەزوورە، بەڵام هاتووە بە شێوەزاری سلێمانی نووسیویەتی کە مەڵبەندی ئیمارەتی بابان بووە، ئەگەر چی زمانی ئیمارەت زیاتر فارسی، یان عەرەبی بووە ئەوە نالی –یە بۆتە پێشەنگ و بە کوردی نووسیوە.

ئەو پەیوەندیەی نالی بە دەسەڵاتدارانی بابانەوە بەگشتی و بەتایبەتی لەگەڵ سولێمان پاشا و دواتر ئەحمەد پاشای کوڕی کە پێ دەچێ لەگەڵ نالی هاوتەمەن بووبن، پەیوەندییەکی "خادیمی مەخدومییە و ماقووڵی ناماقووڵییە" پەیوەندی "هود هود و سلێمان"ە. نالی پێویستی بە چوارچێوەیەک بووە بۆ خەوندیدەییەکەی ئەو چوارچێوەیەش دەبوو ئیمارەتی بابان بێ.

ڕەهەند و وێستگەیەکی تری ئەزموونی شیعریی نالی لەو سەردەمەدا ئەو تەبع توندییەتی لەگەڵ شێخ و دەروێش و زکر و ڕیایان. (بنواڕە وشکە سۆفیی و ڕەقسی بە هەلهەلە، دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە) یان (سۆفی چییە ئیشی تۆ هەر کایە حەشیشی تۆ!) یان (شێخیی و سەر لنگە دەستاڕی بە دەستاری بوزورگ..) (ڕیشەکەی پان و درێژە بۆ ڕیا خزمەت دەکا، زاهیرە هەرکەس بە تول و عەرزی ڕیشیدا ڕیا).

ئەو دوو وێستگەیەی دەسەڵاتی بابان و هی شێخ و سۆفی

هەردووکیان کاریگەریی ڕاستەوخۆیان هەبووە بەسەر شاعیرەوە دواتریش لە نەگەڕانەوەی لە شامەوە بۆ وڵات. ئەو دوو لایەنە یەکیان بە ئیجاب و ئەوی تریان بە سلب دەبنە هۆکار بۆ ئەو ئەنجامە.

## "نالی" بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە سەد داوی نایەوە

نالی لە سلێمانییەوە دەچێتە سنە بۆ خوێندن و لە مزگەوتی داروئیحسان دەخوێنێ و لەوێ ژوورێکیشی دەبێ کە تا ئێستا ماوە. ئەو ماوەی لەوێ بووە بۆ خوێندن، پێ دەچێ دڵی چووبێتە سەر مەستوورەی کچە میری ئەردەڵان بەڵام مەستوورە شوو بە خوسرەو خانی والی سنە دەکا لە ١٨٢٨-١٨٢٩. ئەو کاتە نالی دەوروبەری سی ساڵان بووە، بەر لەوەی سنە بەجێبهێڵێ شیعرێکی ئیرۆتیکی لەبارەی عەورەتی مەستوورەوە دەنووسێ پاشان سنە جێدەهێڵێ و دەگەڕێتەوە. ئەو شیعرە بەر لە شووکردنی مەستوورە نووسراوە هەروەکو لە وێنەو دیمەنەکانی ناو دەقەکە دەردەکەوێ شیعرەکە یەکێکە لە قەسیدە دانسقەکان و جورئەتێکی کەم وێنەشی تێدایە کە دواتر دێمە سەری. بەهەرحاڵ تا ئەمڕۆ ئەوقەسیدەیە و نامە شیعرییەکەی کە بۆ سالمی نووسیوە لە شامەوە، بوونەتە دوو وێستگەی گرینگی ئەزموونی نالی، یەکیان لە ئیرۆتیک و ئەوی تریان لە باسی غەریبی و غوربەتدا.

"حەبیبە" ئەگەر ناوی کیژێکی شارەزووریی، یان قەرەداخی، یان سلێمانی بووبێ، یان ناوێکی خوازراو بەهەر بارێکدا بووبێتە مایەی خرۆشاندنی هەستی نالی ئەوە لە ڕێی ئەوەوە تەعبیر لە دڵدارییەکی زەمینی دەکاو بوون و گەردوون بە چاویلەکەی ئەو عەشقەڵێک دەداتەوە. پێ ناچێ نالی حەبیبەی هێنا بێ، چونکە ئەگەر ئەو ژوورێکی لە مزگەوتێکدا هەبووبێ تا سلێمانی بە یەکجاری جێ هێشتبێ هەر لەو ژوورەدا بووبێ چۆن ڕێی تێ دەچێ کەسێک ژن و ماڵی لەناو مزگەوتدا دانابێ، دەزانم هەندێکجار ماڵی مەلا بە تەنیشت مزگەوتەوە بووە، بەڵام ژوورێک لەناو مزگەوتدا ئەوەیان بۆ نالی نەشیاو بووە. هەروەها لە شیعرەکانیشیدا دەردەکەوێ کە ژنی نەهێنابێ و منداڵیشی نەبووبێ (شیعرەکانم کە جگەرگۆشی منن دەربەدەرن) گەواهێکی تر بۆ ئەوەی کە نالی و حەبیبە بەیەکتر نەگەیشتوون ئەو شیعرەیەتی کە بۆ مەرگی باوکی حەبیبەی نووسیوە کە دەڵێ: ماتەم وەکو زوڵفەینی سیپیە، گرتی خەرابات... تا دەگاتە ئەوەی دەڵێ:

بێ بابییی تۆ بۆ من و تۆ بابی فتوحە

یان: بێ بابیی تۆ موریسە بۆ وەسل و مولاقات.... تاد.

خۆ دەکرێ بڵێین دوای ئەو ماتەمە ڕەنگە بەیەک گەیشتبن، ئەوەشیان گریمانەیەکی لاوازە و دیمەنەکانی تری شیعرەکان دژی ئەو گریمانەیە دەوەستنەوە.

دواگەواهیش بۆ ئەوەی نالی تا ئەو کاتەی لە شامیش بووە دڵی هەر لەلای ئەو یارە بووە، کە بۆی نەبووە ئەو دێڕەی شیعرەکەیەتی کە دەڵێ: (حاڵی بکە بە خوفیە: کە ئەی یاری سەنگ دڵ، نالی لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور).

ڕوایەتێکی لاوازیش هەیە کە "ئایشە" ناوێک لە تەکییەی قەرەداخ هەبووە و لە کۆتایی سەدەی نۆزدە مردووە، ئەو ژنە خۆی ئیدعای ئەوەی کردووە کە دڵخوازی نالی بووە، عەلادین سەججادی ئەو قسەیەی لە زاری شێخ بابە عەلیییەوە تۆمار کردووە کە ماوەیەکی زۆر لەو ناوچەیە ژیاوە. واتە کە نالی لە شام بووە ئەو ئایشەیە ماوە، ئەوجا کێ دەتوانێ مەزەندەی ئەوە بکاو بڵێ و ڕەنگە یاری سەنگ دڵ! ئەو ئایشەیە بووبێ؟! پێم وایە ئەو جۆرە مەزاندانە ئێستا گرینگ نین لە ئەزموونی نالییدا هێندەی دۆزینەوەی دەق و بەرهەمی نادیاری ئەو شاعیرە گرینگن. چونکە ڕێی تێ ناچێ شاعیرێکی زاناو زمانزانی شارەزا لە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی و ئەو هەموو زانیاریی و ڕۆشنبیرییە بە شیعرەکانییەوە دیار بێ کەچی کتێب و نووسینی هەر ئەوەندە بێ کە هەیە، ئەگەر چی ئەوەی هەیە گەنجینەیەکی لە ڕادەبەدەر پڕ بەهایە، بەڵام مەنتیق دەڵێ شتی تریش هەیە، کا بۆ ئەو ڕۆژەی دەستێکی دڵسۆز دەگەڕێ بۆ دۆزینەوەیان.

پێشتر باسی شیعرێکی ئیرۆتیکی ئەو شاعیرەم کرد ئێستا دەچمەوە سەری و دەپرسم، ئەو جورئەتەی نالی لە بەرانبەر مەستوورەدا هەیبووە لەبەرچی وێنەی شیعریی لەو چەشنەی نەبووە بۆ حەبیبە؟ کە باسی لەشی حەبیبە دەکا هەست دەکەی هەموو لەشی هەر چاوە، هەر زوڵفە، هەر ئەبرۆیە، هەر لەبە هەم تیبە و هەم تەبیبە. یان ئەگەر باسی لە ڕینەوەی مەمکی، یان قەدی عەرعەر و قامەتی سەروی زۆریش هەڵکشا بێ ماچی دەمی خۆشابێ، کەچی بۆ مەستوورە (تەرکێکی وەها ناسک و پڕ لەزەت، ساحیبی خەیمە بە پەردێکی دوو ئەستوونە بە پا بێ، سەر تیلەکی نەختێ بە نەزاکەت قلەشا بێ...) (لەو کانییەدا چووزەرە ڕێواسێ ڕووا بێ، بەو چووزەرە ڕێواسە کەمێکی قلەشابێ).. دیارە ئەم جۆرە وەسفانەی بۆ حەبیبە نەبووە، ڕەنگە هەندێک لە هۆیەکان پەیوەندیان بە هۆکاری دەرەکییەوە هەبووبێ، بەڵام ئەوانە بەس نین بۆ وروووژاندنی ئەو جۆرە هەستە، واتا ململانێی نێوان هەردوو ئیمارەتی بابان و ئەردەڵان، یان هەر شتێکی لەم جۆرە نابێ بە پاساو بۆ خرۆشانێکی شیعریی لەو چەشنە ئەگەر عاملێکی زاتی ناخ نەجووڵێنێ. ئەو جورئەتەی لەبەرانبەر مەستوورەدا هەیبووە نالی لە باسی لەشی خۆیدا هەمان جورئەتی هەبووە، لە شیعری "ئیلتیقای پۆڵاو ئاسن"... یان "شەوی بەهاری جوانی خەوێ بوو پڕ تەشویر"، یان لە دوا پەرەگرافەکانی قەسیدەی مەستوورەدا باسی لەشی خۆی دەکا (تولانیی و بەرجەستە وەکو دەستی دووعابێ) (شەو نائیم و قائیم) (بەمەسەل عەینی عەسا بێ) ئەوانە شایەدی جورئەتی شاعیر دەدەن لە بارێکدا، کەچی حەبیبەی دولبەر لەبارێکی تردایە، ئەوەش شتێکی سروشتیە کە

شاعیر سنووری لەش بە دیووی دیار و دەرکەوتوو دابنێ لە یارەکەیدا.

نالی ساڵی ١٨٣٨ کە شیعری "تا فەلەک دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو" کە بۆ کۆچی دوایی سلێمان پاشا و لەسەر تەختی بابان دانیشتنی ئەحمەد پاشای نووسیوە لە سلێمانی بووە.

نالی لە حەج، دەوروبەری ١٨٤٦ کە حوکمی ئەحمەد پاشا دەڕووخێ، لەوێوە دەچێتە شام واتا لە ١٨٤٤ و ١٨٥٥ پێ دەچێ چووبێتە حەج، یان پێشتر چۆتە شام و لەوێ هەواڵی رووخانەکەی پێ گەیشتووە، لە شام نامە شیعرییەکەی بۆ سالم نووسیوە. بە پێی لێکدانەوەی رێبوار سیوەیلی بۆ فەزای قەسیدەکە و پرسیارەکانی شاعیر لەو شوێنانەی جێی هێشتوون هەست بە گەرموگوڕییەک دەکرێ وەکی ئەوەی تازە ئەو شوێنانەی جێ هێشتبێ. هەرچی عەلادین سەججادییە دەڵێ، نالی لە ١٨٣٠ دەچێتە حەج و پاشان دەگەڕێتەوە شام و ساڵی ١٨٣٤ قەسیدەکەی لەوێ دەنووسێ. کەچی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس وای لێک داوەتەوە کە ئەو نامەیە دوا بە دوای شکانی ئەحمەد پاشای بابان نووسراوە کە دەکاتە ١٨٤٧ یان پاش دەست لەکارکێشانەوەی عەبدوڵلا پاشای بابان واتە لە ١٨٥١دا.

بە گوێرەی لێکدانەوەی مەسعوود محەممەد و پاشان رێبوار سیوەیلی و مامۆستا جەعفەر و د. عەبدوڵلا حەداد و هەندێکی تریش لە نووسەران، ئەو واقیعەی لە شیعرەکەی (نالی) داو لە وەڵامەکەی (سالم)دا دەرکەوتووە ئەو رایە پشت راست دەکەنەوە کە نالی لە تەمەنی دەورووبەری پەنجا ساڵیدا ئەو شیعرەی نووسیوە.

بە پێی ئەو زانیارییەی ئا. خۆدز کۆ دیپلۆماتی رووسیا کە لە پاریس خەریکی لێکۆڵینەوەی دیالێکتی زمانی کوردی بووە ساڵی ١٨٥٧ لە گۆڤاری ئاسیادا بڵاوی کردۆتەوە کە ئەحمەد پاشا لە پاریس پێی وتووە نالی ئێستا (١٨٥٣) لە دیمەشق (شام) دەژی، ئەو زانیارییە ئەو بۆچوونەی سەرەوە باشتر دەسەلمێنێ لەمەڕ ساڵی نووسینی قەسیدەکەوە.

بەڵام سەبارەت بە بەشەکەی تری قسەکانی ئەحمەد پاشا کە خۆدزکۆ نووسیویەتی، نالی خەریکی لێکۆڵینەوەیە لەبارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی شێوەی سلێمانی، شتێکی ئەوتۆ دیار نییە و تا ئێستا پێ دەچێ ئەو نووسینانە نەدۆزرابنەوە، یان فەوتاون.

نالی بۆ نەگەڕایەوە؟

ئەگەر سەرنج لەو دێڕەی سالم بدەین کە لە وەڵامی نامەکەیدا بۆ نالی نووسیوە و دەڵێ:

توخوا بڵێ بە حەزرەتی نالی: دەخیلی بم

بەم نەوعە قەت نەکا بە سولەیمانییا گوزەر

ئەوە دوو شتمان بۆ روون دەبێتەوە، یەکیان پلەوپایەی نالی لای شاعیرانی هاوسەردەمی خۆی و ئەوی تریان ترسی سالم لەسەر ژیانی نالی ئەگەر بگەڕێتەوە نیشتمان، نیشتمانێک کە پڕە لە تورکی رۆمی و زوڵم و ستەم و شین و شۆڕ، بە جۆرێکی تر دەتوانین ئەو قسەیەی لێکۆڵەرەوەکان پشت ڕاست بکەینەوە کە نالی لەلایەن ناحەزانی نەتەوە و ناحەزانی ناوخۆشەوە (شێخ و سۆفی...) ژیان لەبەردەم هەڕەشەدا بووە، بۆیە بڕیاری نەگەڕانەوەی یەکجارەکی داوە.

دوای شام پێ دەچێ نالی چووبێتە ئەستەمبووڵ و ماوەیەکیش لەوێ مابێتەوە ئینجا ساڵی (١٨٦٧ - ١٨٦٨) چۆتەوە حەج و لە حیجاز (مەککە) ماوەتەوە. بە گوێرەی نووسینێکی نووسەری عەرەب محەممەد ئەلحەزراوی لە کتێبی "نزهة الفکر فیما مضی من الحوادث والعبر في تراجم رجال القرن الثاني عشر و الثالث عشر "، کە لەبەشی پیتی (خ) دا لەبارەی نالی نووسیویەتی:

"ولد بالعراق بمدینة شهرزور، ثم اخذ في العلوم و تحصیلها حتی برع في فن الادب وعلوم اللغة، معظم عند اهل الرتب. قدم مکة سنة نیف و ثمانین و مئتین والف و حظي بالقبول عند فضلائها..."
"وله ملکة تامة في البحث في انساب العرب ومحاوراتهم واشعارهم، والرجل صاحب فضل و علم..."

ئەو پێشەکییە کورتەی ئەلحەزراوی هێما و ئاماژە بۆ هەندێک لایەنی ژیان و هەڵسوکەوت و پلەوپایەی نالی دەکا، ناوهێنانی بە نالی ئەفەندی پلەوپایەی ئایینی و کۆمەڵایەتی ئەو شاعیرە دیاری دەکا و ڕستەی دواتریش ئاستی زانستی و زانیاری و شارەزاییەکەی دەسەلمێنێ (هەرچەندە دەقە شیعرییەکانی باشترین شایەدن لەم ڕووەوە)، ئەو قسانەی ئەلحەزراوی دیسان ئەو گومانە زیندوو دەکەنەوە کە نالی دەبێ کتێبی تری هەبووبێ لەبارەی زمان و ئەدەب و شیعریشەوە زانراوە کە لە سلێمانی بووە سیپارەیەکی لە عەرەبییەوە کردۆتە کوردی بۆ فێربوونی قەواعیدی زمانی عەرەبی و کاتی خۆی لەناو فەقێیاندا ئەو نامیلکەیە خوێندراوە. هەروەها "مناظر الانشاء"ی لە دەرەوەی وڵاتدا نووسیوە لە ١٨٤٩ لەسەر داوای نالی لەلایەن ناسخێکەوە نووسراوەتەوە، بەم دواییەش کتێبێکی لە ئەستەمبووڵ دۆزرایەوە کە باسی عەرووز دەکا و بە زمانی فارسییە، هەروەها قسەش هەیە کە "ئازارەکانی فارتەری لاو"ی گۆتەی کردبێتە کوردی. هەروەها ئەو پێشەکییەی "نزهة الفکر" تەمەن و سیمایەکی خێرای ئەو شاعیرەشمان نیشان دەدا و ئەو گێڕانەوەیەی مەسعوود محەممەدیش پشت ڕاست دەکاتەوە کە لە زاری باپیرییەوە جەلیزادە گێڕایەتییەوە کە نالی لە حەج دیووە و تەمەنی زۆر بووە واتە ١٨٧١-١٨٧٢ ئەو ساڵەی جەلیزادە نالی تێدا دیوە دەبێ ٣ ساڵ بووبێ نالی هاتبێتە حیجاز.

بە پێی نووسینەکەی نووسەری عوسمانلی محەممەد تاهیر بورسەلیش لە کتێبی "عوسمانلی موئەلیفلەریی" کە دەنووسێ: "نالی ساڵی (١٢٩٠ کۆچی) لە حەجی شەریف گەڕایەوە، ئەو ماوەیەی لە ئەستەمبووڵ مایەوە، بەوپەڕی ڕێز و شکۆدارییەوە زانا و شاعیرانی ئەستەمبوڵ ڕوویان تێ دەکرد، پاش بەینێک وەفاتی کرد و لە گۆڕستانی قاراجا ئەحمەد karaca ahmed تەرمەکەی بەخاک سپێردرا". د. عەبدوڵڵا حەداد ئەم نووسینەی لە کتێبی "نالی لە دەرەوەی کوردستاندا" ساڵی بڵاوکردۆتەوە. هەرچی ئەمین فیزی بەگە لە "ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد"دا دەنووسێ: "نالی چووەتە ئەستەموول لە ئەسنای سوحبەتا لەگەڵ ئودەبا و فوزەلای ئەوێ، گەلێ ئاساری فیکر و فەتانەتی نواندووە، زۆر مەزهەری تەوەججوە بووە. تا نهایەتی عومری لە ئەستەموولا ماوەتەوە. مەدفەنی موبارەکی ئەوەتە لە (ئۆسکۆدار)..."

کەوابوو نالی نزیکەی سی ساڵ لە تاراوگە ژیاوە (مەککە، شام، ئەستەمبووڵ... ئەگەر شوێنی تریش نەچووبێ کە تا ئێستا نەزانراوە).

بەگوێرەی بەیازەکەی لای سدیق بۆرەکەیی کە لە مێژووی ئەدەبی کوردییەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە نالی لە نێوان ١٢١٢-١٢٩٥ ژیاوە واتە ٨٣ساڵ تەمەنی بووە کە دنیای جێ هێشتووە. بە گوێرەی ئەو ڕووداو و ساڵانەی لەم بایۆگرافیەدا هاتووە لە نێوان (١٧٩٧-١٨٧٣)دا نزیکەی ٧٦ ساڵ ژیاوە.

وەسفی سیمای نالی زۆر دیار نییە، ئەلحەزراوی لەو بارەیەوە نووسیویە: صاحب فضل و علم مع انکسار و شیبة بهیة و خمول. واتا شکانەوەیەک لە سیمایدا بەدی کراوە و پیریی و شکۆداریی پێیەوە دیار بووە لەگەڵ جۆرە سستییەک. ئەو سستییە ڕەنگە لە شێوەی جووڵانەوەی، یان ئاخاوتنیدا هەبووە، کە ڕەنگە کاریشی کردبێتە سەر نووسینی، کەچی لە شیعرەکانیدا ئەو سستییە کەمتر دەرکەوتووە.

مامۆستا جەعفەریش وای بۆ دەچێ کە ڕەنگە تانەیەک لە سەرچاویدا هەبووبێ، ئەو لەو بۆچوونەیدا پشتی بەو دێڕەی نالی بەستووە کە دەڵێ: (نالی) ئەو نوقتە کەوا بوو بە نیشانەی چاوی. تا ئێرە و بە پشت بەستن بەو زانیارییانەی لە کتێبەکانی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مەسعوود محەممەد و د. مارف خەزنەدار و د. عەبدوڵڵا حەداد و ڕێبوار سیوەیلی و مامۆستا جەعفەر...... تاد، هەن ئەم بایۆگرافییەمان ئامادە کردووە.

دەروونم خاڵییە، وەک نەی دەناڵێ
هەوارێکی چ پڕ هاوارە بێ تۆ!

ئەدیبێکی وەک نالی کە بەلای بیروباوەڕی منەوە، یەکێکی لە شاعیرە هەرە پێشکەوتووەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلام - نەک تەنها هی کورد - گلەییی ئەوەی لێ ناکرێ بۆ کەیفی سەد ساڵ دوای خۆی شیعری هەڵنەبەستووە، لەوەشدا سەرشکێن ناکرێ کە شێوازی شیعری کۆنی بەکارهێناوە. لەم لایەنەوە دەبێ بڵێین، نالی ئەگەر ئەوە نەبا کە هەبوو، گلەییی لێ دەکرا و گومان دەچووە سەر شاعیریەتی، چونکە دەبێ مرۆڤ کوڕی سەردەمی خۆی بێت. کە ئەو کوڕە نەبێ، دیارە ناتەواوییێک لە نەفسی وەیا لە هونەریدا بووەتە لەمپەر لە پشتی و کردووەتی بە مرۆڤێکی تار بووی لە تێکڕای خەلق. نالی بێ وەیا یەکێکی تر بێ هەر ئەوەندەی لێ داوا دەکرێ بە پێی مەفهوومی سەردەمی خۆی مافی ڕێز لێگرتنی هەبووبێ، تا ئێمەش ڕێزی لێ بگرین، چ ڕەوای هەق نییە، ئێمە بێین دوای سەد ساڵ لەو سەردەمە هەموو خەلق بە درۆ بخەینەوە لەو ڕێزەی کە لە یەکێکی وەک (نالی)یان ناوە. وا دەزانم ئەم قسەیەی لێرەدا دەیکەم چ دەمەتەقە هەڵناگرێ لە منیش بە پێشەوە کەسانی تر گوتوویانە. هۆی دووبارەکردنەوەی لێرەدا، زێدە پێویستی میللەتەکەمانە بۆ خۆ بەسەهوونەبردن و خۆ زەرەرمەندنەکردن. لە فەرزی میللەتی ئینگلیز خۆ گێل کا لە ئاست (شەکسپیر) ئەوەندە شاعیر و ئەدیبی گەورەی تری دەمێنێتەوە، دڵی خۆیان پێ خۆش کات. سەروەت و سامانەکە و قابریقە و داهاتە زۆرەکەشی چی لێ کەم نابێتەوە، بەنەهێشتنی ناوی "شەکسپیر" لە فەرهەنگی ئەدەب و هونەرییدا. خۆ ئەگەر ئینگلیز لەم پلەیەی بێ ئینسافییەش تێ پەڕێنێ و هەموو ڕابردووی خۆی بسڕێتەوە - کەهەرگیز نایسڕێتەوە- حورمەتی ڕووپەڕە بێ حورمەتەکانیشی دەگرێ، حازرێکی هێندە دەوڵەمەندی هەیە بۆی تێ بێنێتەوە لە سڕانەوەی ڕابردووی. بەڵام کورد چی ئەوتۆی نییە لە ئێستاکەیدا دڵی خۆی پێ خۆش بکات لە بەرامبەر کاری منداڵانەی ڕیسواکردنی ڕابردووی خۆی. کورد لە بارێکدایە بۆی بپارێزێتەوە، نەک لێی کەم کەیتەوە. بەتایبەتی کە خۆت کورد بیت، خۆ هەر بە جارێ بێ عوزر دەبیت ئەگەر لێکەمکردنەوەت لە مەیدانی بایەخداری زێدەبەنرخی شیعر و ئەدەبی کۆنی بێت کە هیچی وەک ئەو بە نرخ نییە.

لەم گەشتەی ناو باخ و ڕاغی هەڵبەستەکانی نالیدا، چەند نموونەیەکی ئەوتۆمان دیت کە لەناو نموونەی هەرە پێشکەوتووی ئەدەبی ڕۆژهەڵاتدا، پرشنگ بدەنەوە و نموونەکانی تر کزکەنەوە لە نەزەر خۆیاندا. ئەم بەرزییەی ئەدەبی نالی، جارێکی تریش بەرز دەبێتەوە کە بەبیر خۆت بێنییەوە نالی ڕەوشتێکی پاک و نەفسێکی ڕێز لەخۆگرتووشی هەبووە و لەو ئەدیبانە نەبووە عەیب و عاری ڕەفتاری نالەباری لەناو مەخمەڵی هەڵبەست و بشارێتەوە، چ نهێنییان ئاشکرا ناکەم، بەوەدا کە بڵێم زۆر لە شاعیری ناسراوی خاوەن شۆرەت لە کۆن و نوێدا، ئەگەر شیعر و هونەر شەفاعەتیان بۆ نەکەن، لەوانە نەبوون بە برادەری خۆتیان قبووڵ کەیت، نەوەکا ناوت بەد بێ پێیانەوە. نالی سەرەڕای ئەوە کە چ عەیبێکی لێ نەدیتراوە، تا بشڵێی ڕاست و دڵسۆز بووە لەگەڵ بیروباوەڕیدا. چی لە دڵدا بووە، ئەوەی گوتووە و بەدرێژاییی ژیانی سوور بووە لەسەر قەناعەتەکانی. بەڕاستی، نالی یەکێکە لەو شاعیرانەی قەناعەت گۆڕییان نەکردووە. هەرچەند ئەم نووسینە جێی ساغکردنەوەی قەناعەت و بیروباوەڕی نالی نییە. بەڵام جێی ئەوەندەی تێدا دەبێتەوە بە پێی داخوازی موناسەبە، بڵێم، دیوانەکەی سەر و بن کەیت و شیعرەکانی بەوپەڕی وردییەوە بخەیتە بەرچاوی زیهن و مەنتیقەوە، چ فەرقێک ناکەی بە قەناعەتە بنجییەکانی لە قەسیدەیێکەوە بۆ قەسیدەیێک، وەیا لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی تر. وەک من لە نالی دەگەم، ئەگەر پێمان بکرێ لیستەیێکی زەمەنی بۆ شیعرەکانی ڕێک خەین، لێمان مەعلووم دەبێت ئەو لە تەمەنێکی مەیلەو زووەوە بەرەو پێکهێنانی بیروباوەڕ چووە. هەر ئەم زووکردنەش بووەتە هۆی خێرا ڕۆیشتنی بۆ حەج. تەنانەت نامەکەی بۆ (سالم) و پرس پێکردنی لە بەرژەوەندی گەڕانەوەی دووچاری وەزع و ژیانێک بێ کە خۆی لێی ڕازی نییە. دەمەوێ بڵێم پەرۆشی بۆ قەناعەتەکانی وای لێ کرد ڕاستەوخۆ نەگەڕێتەوە. لە حاڵێکدا ئەو دەزانێ بەسەرچوونی دەسەڵاتی بابان و هاتنی حوکمێکی بێباکانەی عوسمانی، لەوانەیە ڕێ لە ئازادیی ڕەفتار و قەناعەتی بگرن و مەیدانی لێ تەسک کەنەوە، بەتایبەتی، چونکە ئەو لە سەردەمی حاکمەکانی باباندا هەرگیز ناچار نەبووە لە ئاوی باوەڕی لێڵ بخواتەوە. دیارە لە حاڵی وەهادا تێکچوونی وەزعی سلێمانی بەنیسبەت نالییەوە، ناخۆشتر بووە تا کەسێکی تر کە وا نەزۆر دەربەستی باوەڕ بێ و نەلە سەردەمی باباندا مەرحەبای دیبێ. نالی کە لە شام مایەوە و دوایش پاش گەیشتنی وەڵامی سالم پێی چوو بۆ ئەستەمبوڵ، بێ ئەوە هیچ هۆیەکی گوزەرانی مسۆگەری هەبێ وەیا بەتەمای پەیداکردنی پایەو ڕوتبە و نیشانێک بێ، خۆی دزییەوە لە گەڕانەوە بۆ سلێمانی لە ترسی بەرەنگار بوونی وەزعی بێحورمەت بەدەست حوکمی کەم ئینسافی عوسمانییەکانەوە. ئەگەر ئەم ترسە بەرهەڵستی لێ نەکردبا، دەیتوانی لە سلێمانی ئەو کەرتە نانە پەیداکا کە لەشام و ئەستەمبوڵ پێی قانع بوو. هەر جارەی کە ئەم بەیتەی لای کۆتاییی نامەکەی بۆ سالم، دەخوێنمەوە، لەگەڵ تەزووی سۆز و هەستی پەرۆشم بۆ نالی، دیمەنی مرۆڤێکی جوانمەردی ڕێز لەخۆگرتووشم دێتە بەرچاو کە مەرگی غەریبانەی ڕێز لێگیراو، تەرجیح دەداتە سەر ژیانی ناو کەسوکار بەبێ حورمەتی و بێ دەسەڵاتی:

نایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە
یا مەسڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی سور

دیارە نالی لەم مەسڵەحەتەدا، مانگانەی دووکان و قەیسەری داهاتی زەوی و زارە نەبووەکانی مەبەست نییە، پرسیاری ئەو لەبارەی بوونی وەزعێکەوەیە کە بتوانێ تێیدا گوزەرانی نەمر و نەژی بکا لەگەڵ پاراستنی دڵۆپی ئابڕوودا. پێش من سالمیش لە نالی گەیشتووە، بۆیە لەوەڵامدا باسی بێدادی و بێحورمەتی تورکەکان دەکا، نەک نەبوونی نان و گوزەران:

شارێکە پڕ لە زوڵم و مەکانێکە پڕ لە شین
جاێنکە پڕ لە شۆڕ و وڵاتێکە پڕ لە شەڕ
سالم سفەت لەبێ کەسییا بانەبێ هەلاک
من کردم ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر

لێرەدا، ڕەنگە پرسیارێک بکرێ و بگوترێ بە نیسبەت نالییەوە ئەستەموڵ و شام و سلێمانی چ فەرقێکیان دەکرد؟ خۆ هەر عوسمانلی حاکمی هەمووان بوون؟ پرسیارەکە بێ جێ نییە. بەڵام بێ وەڵامیش نییە. لە تەجروبەی خۆمان دەزانین ژیان لە جێگایێکی تازە داگیرکراوی وەک سلێمانی، بۆ کوردێکی شەرم بەخۆی موحتەرەمی وەک نالی، سەختتر و جێی گومانترە تا ژیانی ئەستەمبوڵ وەیا شام کە لەوێدا داگیرکەری عوسمانی پەلپی بێ حورمەتیکردن بە غەریبێک ناگرێ کە لە هیچ ڕوویێکەوە نایێتە ناو حیساب و بەرژەوەندی چاکە و خراپەوە و چ لەمپەران لەبەر پێی هەڵنانێ. لەمەش بەولاتر، شاری گەورە و قەڵەباڵغ چاکتر دەبێتە حەشارگە بۆ کەسێکی بیەوێ بەرچاو نەبێ. نالیش لەوە زیاتری نەویستووە ژیانێکی ڕەشۆکیی بێ ئارایشت لەناو ئاپۆرەی شاری گەورەدا چەپارەی بدا لە نیگای ناڕەزای میری و ئەو هەڵمەتەکاسانەی خۆی لە میری نزیک دەکەنەوە، بەتیوەگلاندنی بابای وەک نالیی ڕێز لە خۆگرتوو.

ئەم بە قەناعەت نازینە و لەخۆڕازیبوونی نالی لە گەلێک ڕەفتاری تری نالی سەر هەڵدەدەن. جارێ چەندێک سەیری هەڵبەستەکانی بکەیت پارانەوەی لەبەر کەس تێدا نابینیتەوە، خۆ داواکردنی یارمەتی و لووتەخۆری هەر هیچ، نووسەرێکی کورد لە پێشەکیی دیوانە چاپکراوەکەی نالی خلیسکی بەخامەی خۆی بردووە و نالیی شکاندووتەوە بەو یەک دوو ناو بردنەی حاکمەکانی بابان کە لە چەند موناسەبەیێکدا هاتوونەتە ناو شیعرەوە. بەرامبەر ئەم شکاندنەوەیە چەند وەڵامدانەوە و ڕاستکردنەوە و ڕوونکردنەوە هەن:

یەکەم: گەلی کورد بە ئاواتەوەیە لە مێژووی خۆیدا هەڵکەوتی وەها پڕ شانازی بدۆزێتەوە کە ئەدیبێکی کورد مەدحی حوکمڕانێکی کوردی کردبێ. وەی کاشکی سەرلەبەری ئەدەبی کۆنمان مەدحی بەروبارەگا و دەست و قام و جوامێریی حاکمە سەربەخۆکانی کورد بوایە. کاشکی کورد خاوەنی ئەو حوکمڕانە بوایە بە درێژاییی مێژوو مەدح کرابایە. نالی کە دێ و مەدحی (تاقمە مومتازەکەی شاە) دەکات تابلۆیێکی پڕ سەرافەتی مێژووە هەژارەکەی کوردمان بۆ دەکا بە نەمر، چ دەستێکی سواڵ و سەدەقەشی تێدا پان نەکردووەتەوە بیێتە لەکە لەو تابلۆیەدا. لاواندنەوە و پیرۆزباییەکەشی بۆ مەرگی سلێمان پاشا و حوکمڕانیی ئەحمەد پاشا، لە قەسیدەکەی (تا فەلەک دەورەی نەدا) ئەویش وەک هی (تاقمی مومتازی شاە) هەستی بەخۆ نازینمان زیندوو دەکاتەوە و گیانی کوردایەتیمان زیندووتر دەکات. بەشێکی زۆری هەتیوایەتیی کۆنینەشمان لەبیر دەباتەوە بەوەدا کە پێمان دەڵێ ئەمیرێکمان هەبووە لە مردنیدا بۆی بگرین وەیەکێکی تریشمان هەبووە لە هاتنی بۆ سەر تەخت پیرۆزباییی لێ بکەین. لەم قەسیدەشدا، نالی هێندە بڵند دەڕوانێ و خۆی بەرز دەکاتەوە لەلایەنی چاوچنۆکییەوە دەتوانم بڵێم پێی دەگاتە شانی (أبو تمام و بحتری و متنی). بەڕاستی ئەم گیانی بەرزبوونەوەی نالی ژووورووی گومان لێکردنی یارمەتی خواستن کە لەم دوو قەسیدەیەدا دەچنە ناو بیبیلەی هەموو چاوێکی بیناوە، دیمەنێکی یەکجار ئاشکرای بەخۆ نازینی نالی دینێتەوە ناو هەڵبەستەکانەوە، هەندی مەدح و لاواندنەوەکە جێی خۆی کردووەتەوە. بەلێوردبوونەوە دیار دەکەوێ نالی لەم قەسیدەیەدا بە پێی حوکمی سروشت و ڕەوشتی فیکری لە ئارمایی دەست پانکردنەوە دوور کەوتووەتەوە، نەک لەبەر خۆپاراستنی دوای لێکدانەوە. چونکە لە هەردوو قەسیدەدا تاکە یەک وشە نادۆزیتەوە باسی سەخاوەت و بەخشینی مەدحکراوەکان بکات. چ جای ئەوەی داوای یارمەتی بکات. بەمەدا دیارە نالی دڵ و دەروون و فکر و زەینی بەلای چاوچڕکردنەوەدا نەڕۆیشتووە، هەر بیریشی لێ نەکردووەتەوە. چونکە ئەگەر لە گۆشەیێکی هەست و نەستیدا وێنەی ئارمایی خواست و نیاز هەبا، خۆشی بێ و ترشی بێ، سێبەرێکی ئەو ئارماییە دەکەوتە ناو هەڵبەستەکانییەوە، وەیاخود هەر نەبێ لە وشەیێکیاندا (ئحم)ێکی وەک هی کابرای گۆشەی مزگەوت دەبیسترا.

لێرەدا پێویستی ڕوونکردنەوە و وەرامدانەوە باسی دوو قەسیدەی هێنا ناوەوە کە مەدحی پاشای بابان و تاقمی تایبەتی ئەوی تێدایە. نالی لە تاکە بەیتێکی تریشدا مەدحی سلێمان پاشای کردووە، هەڵبەت ئەم مەدحە دەبێ پێش مەرسیەکەی (تا فەلەک بێ). ئەم تاکە بەیتە، چاوی هەموو ئەو ئەدیبانەی لێ خلیسکاوە کە من لە بارەی شیعری نالییەوە ئاخاوتنم لەگەڵدا کردبێ وەیا نووسینیانم خوێندبێتەوە دەربارەی نالی. منیش بەینێکی دوور و درێژ لێی بێ ئاگابووم، تاکو لەناو دەروونمدا واتای بەیتەکەم بۆ ڕوون بووەوە بایی ئەوەی مەدحی سلێمان پاشای تێدا بخوێنمەوە:

هود هودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامەن گیری شاهی ئاسەفی سانی دەکا

بێگومان (شاهی ئاسەفی سانی)(١) لەم بەیتەدا سلێمان پاشای بابانە، چونکە دیارە شاهی ئاسەفی یەکەم سلێمانی پێغەمبەرە، بەخۆی و سەر گوزەشتە قورئانییە زۆر مەشوورەکەیەوە لەگەڵ هود هود و بەلقیس و سەبادا کە لەم بەیتەدا نالی، کردوویەتی بەمەبەستی هەڵبەست، کە سلێمانێکی دووەم هەبێ وەک سلێمانی یەکەم، پاشا بێ و نالی دامەنگیری بێ، کەسێکی تر نییە لە سلێمان پاشای بابان بەولاوە. هەرچەند کەم و زۆر بێ پێوەندیی نالی بەدەرباری پاشاکانی بابانەوە، بەچاکی نەزانراوە و نەبیستراوە، بەڵام لەم بەیتە و مەدحەکانی تریشدا دەردەکەوێ نالی بەهۆی بوێژی بێ مانەندیەوە لە پاشاکان نزیک بووە و ڕێزی لێ گیراوە. دەمودووی ئەم هەڵبەستانەی تامی ئاشنایی و دۆستایەتی لێ دەکرێ، لەگەڵ مەدحکراوەکاندا واش ڕادەگەیەنێ نالی لەسەردەمی حوکمڕانیی سلێمان پاشاوە بووە بە دۆستی نزیکی بابان، چونکە مەدح و پێدا هەڵگوتنی بۆ سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشایە، لەوان بەپێشەوە چ مەدحێکیان لێی نەبیستووە دۆستایەتی و ئاشنایەتی

ڕابگەیەنێ بە پاشاکانەوە.
دووەم: نالی ئەگەر مەبەستی لەم مەدحانەدا نان پەیداکردن بوایە، دەبوو باشتر مەدحی خەلیفە و والی و وەزیر و پیاوماقوولەکانی عوسمانیی کردبا. کەچی نەناوی هێناون، نەلێشیان نزیک بووەتەوە. سەیر لەوەدایە هەر چەند تورکییێکی باشی زانیوە بەدەگمەن نەبێت شیعری بە تورکی نەوتووە. ڕواڵەت وا ڕادەگەیەنێ نالی نەیویستووە، وەیا خۆی نەخستووەتە بارێک، هەڵبەست بە زمانی دەسەڵاتداری بێگانە دابنێت، تەوەک بە خۆتێ هەڵسوون لەسەری حیساب بکرێ و گومانی دەستپانکردنەوەی لێ بکرێ.
نەبوونی مەدح لە هەڵبەستی نالیدا دیاردەیێکە سەربەخۆ. جگە لەو دوو سێ مەدح و ناوهێنانی بە موناسەبە کە بۆ میرەکانی بابانی کردووە تاکە، یەک مەدحی تر لە دیوانەکەی هەیە ئەویش بۆ شێخ نووری ناوێکی ڕوودباری 'ڕووباری' یە:

لە چاوی ڕوودبارم نووری دیتن وەختە تاریی بێ
ئەمیش باماجەرای هیجرانی (نووری ڕوودباری) بێ

لەلاپەڕە ٧٨ی دیوانەکەی چاپی هەولێر، سەیرێکی ئەم هەڵبەستە بکە و نەختێک سرنج بگرە وشەکانی، دەرحاڵ بۆت مەعلووم دەبێ نالی ئەم پارچەیەی بەموناسەبەی چوونە حەجی (نووری ڕودباری) داناوە:

چ میعمارانە بۆ تەعمیری کەعبەی دڵ دەچێتە حەج
خودا یار و مەدەدکار و نیگەهداری عماری بێ

دیارە نالی لێرەدا، مەدحی برادەرێکی خۆی دەکات کە دەچێ بۆ حەج و پیاوێکی خوایی و موسوڵمانە هی دونیا و دەسەڵات و زەبر و زۆر نییە. لە سەرانسەری بەیتەکانیش، دیسان، چ دەستپانکردنەوەیێک نابینرێ. من لەبارەی ئەم (شێخ نووری ڕوودباری)یەوە هەر ئەوەندە دەزانم بەینێک لە کۆیێ ژیاوە و پیاوێکی بەرچاو و ڕێز لێگیراویش بووە. بەپێی گێڕانەوەی دەماودەمی باوکم لە باپیرمەوە، شێخ نووری نانی بە شێخایەتی پەیدا نەکردووە. خۆی خاوەن بەخشین بووە و بەماڵی خۆی خزمەتی خەڵقی کردووە.
نالی لە زەمینەی مەدحدا ئەوەندە کەنارگیر بووە تەنانەت لە پیاوانی ئاینیش تەنها مەدحی پێغەمبەری (ص) کردووە. هەر لە نێوان مەدحی ئەویشدا، ناوی چوار خەلیفەی هێناوە. بەلای باوەڕی منەوە ئەو شیعرەی (عاشورا) کە لە لاپەڕە ٧٥ی دیوانەکەی چاپی هەولێردا چاپ کراوە، نە هی نالییە و نە بەهیچ کلۆجێک دەچێتەوە سەر شێوازی نالی. بڕ شیعرێکی بێ هێزی نابەڵەدانەی بێ تام و شام کە لە شاعیری ڕیزی دووەمی شیعری کوردیش ناوەشێتەوە، چ جایی ئەوەی لایەق بەنالی بێ. نەختێک وردبوونەوە لە بەیتەکان دەری دەخا خاوەنی قەسیدەکە کێیە. لە بەیتی چواردەمیندا شاعیر ڕووی قسە لە خۆی دەکا و ناوێک دێنێ و یا ناوی ڕاستەقینەی خۆیەتی یا نازناویەتی. من لێرەدا بەیتی چواردەم شکلنووس دەکەم لەبەر دیوانەکەی نالی (چاپی هەولێر ١٩٦٢):

عارفا سەد عەقل کل حیرانە وا لەو عالەمە
عالمی اعلم کە بۆ خۆی هەم علیم و اعلەمە

وشەی یەکەمی بەیتەکە (عارفا) بانگهێشتنی (عارف)ە لەلایەن خاوەنی ناوەکەوە. لەمەدا چ گومانێک نییە و دەبێ بتوژرێتەوە کام شاعیری کورد ناوی وەیا نازناوی عارف بووە. بەم پێیە دەبێ کۆتاییی قەسیدەکەش ناوی 'نالی' لێ دەرهاوێژرێ و 'عارف'ی بخرێتە جێیەوە.

لۆمەیی (عارف) مەکەن یاران ئەگەر بمرم لە غەم
خۆش ئەگەر سەد پارە کەم هێشتا لە غەم ئەمرۆ کەمە

پوختەی گوتە لێرەدا ئەمەیە کە شیعرەکان سەرەڕای بێ هێزی و بێ جوانی و بێ هونەرییان، دژی تەبعی نالیشن لە ڕووی ئەوەوە نالی لە مەیدانی دینداریدا ستایشی خوا و پێغەمبەری کردووە و بەس. سەیرێکی ئەم بەیتە قوندیلەیە بکە و پێم بڵێ، بەکام کوێرەڕێیدا، بۆ سەر خەزێنەی گەوهەرەکانی نالی دەبردرێتەوە؟

احمد و اولاد و الشن در عرب شبهی گوڵن
حاصلی گوڵ خارە ئەی دانا دەلیلی محکمە

لەپێش چاوی زیهنی مندا، نالی نەفسی لە بەرزیدا، هاوتای شیعرەکانیەتی لە مەتانەتدا، بە خۆڕایی و بێ بنج نییە نالی هێندە بەخۆی و شیعرەکانی خۆیدا هەڵدەڵێ. دیارە هەستی بە بەرزیی دڵ و دەروونی ئەوەندە بەهێز بووە چ کۆمەی نەکردووە لە دەربڕینی ئەو هەستە، چونکە بەلای خۆیەوە شتێکی وەک بەدیهییەی گوتووەتەوە لە هەموو ئەو کەسانەی مەعلوومە کە دەیناسن. مرۆڤی گومان لە خۆکردوو ناوێرێ لە خۆهەڵدانەوە و ناز بەخۆکردندا خەڵق بێ منەت کات لە ترسی بەدەمدا هاتنەوە و عەیب دیار خستنی. وا دیارە نالی هیچی ئەوتۆی بەخۆی شک نەبردووە لە خەڵقی بترسێنی وەیا چاو شۆڕی کەسی بکات.
کەسێک چ ڕۆژان هەڵوێستێکی بێ حورمەتانەی لە خۆ دیبێ، ناتوانی بەم شێوەیە ژووررووی عالەم کەوێتەوە:

ئەم سەرسەری بازانە کەوا هەمسەری بوومن
موشکیل بگەنە ساعیدی شاهێکی وەکو من

من بەش بەحاڵی خۆم، چەندێکی بڵێی ئەوەندە گەش دەبمەوە بەوەدا کە دەبینم و دەزانم نالی لە ڕەوشت و بەرزیی نەفسدا هاوتای نالیی بوێژ و ئەیبە، چونکە بەڕاستی فەلاکەتە ئەدەبی بەرز بخرێتە ناو نەفسی پەستەوە. پێی ناوێ من بڵێم لەخۆوە دیارە، پیاوی نزم لە گوتنی وشەی بەرزدا درۆزنێکی ئانقەستە. شاعیرێک وەیا ئەدیبێک کە ناو و ناتورەی بە دواوە بوو لە هەموو گوتەیێکیدا تارماییی بەدناوییەکەی لەبەر چاوان قوت دەبێتەوە و قسە خۆشکەڵەکانی بەدرۆ دەخاتەوە، یاخود هەر نەبێ لە بایەخیان کەم دەکاتەوە. وا خۆشە دەست و زمان بەیەکەوە پاک بن. سەد شوکر ئەم خۆشییە لە شاعیریەتیی نالیدا بە زیادەوە پێک هاتووە.

---

(١) باسی ئەم بەیتە بە درێژی لە بەشی دووەمی (حاجی قادری کۆیی) هاتووە.

# ڕوخساری شیعری نالی

## ڕوخساری شیعری نالی لە ڕووی بابەتەوە

مارف خەزنەدار

شیعری نالی بە قەوارە و ژمارە کورت و کەمە، ئەو بەرهەمەی لە بەردەستماندایە دەتوانرێ هەمووی لە دەوروبەری ١٢٠ پارچە شیعری لیریکی بژمێررێ. هەروەها شیعری نالی لە ڕووی بابەتی هونەرە شیعرایەتییەکانی ئەدەبی ئیسلامییەوە (نەتەوە ئیسلامەکانەوە) کە زۆرن، شاعیر ئەو قالبانەی لەم لایەنەوە هەڵیبژاردوون بۆ بەرهەمی شیعری لە چوار جۆر تێپەڕ ناکەن: غەزەل، قەسیدە، موستەزاد، تاک (فەرد).

١- غەزەل: ئەم بابەتە شیعرە لەلای نالی و لە ئەدەبی ئیسلامەوی ڕۆژهەڵات بەو پارچە شیعرە دەووترێ کە ژمارەی دێڕە شیعرەکانی، نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕی دووەم (سەدر و عەجز) لە پێنج دێڕ کەمتر نەبێ، ئیتر بە زۆری ئەم جۆرە شیعرە لە حەوت دێڕ، یا نۆ دێڕ، یا دوازدە دێڕ پێک دێ، هەندێ کەس دەیگەیەننە هەژدە و تا بیست دێڕیش. ئەگەر ژمارەی دێڕە شیعری غەزەل لەمە تێپەڕ بکا قەسیدەی پێ دەڵێن. لە ڕووی کێشەوە پێڕەوی دەستوورەکانی کێشی عەرووز دەکا، هەرچی قافیەشە لەسەر سیستێمی یەکیەتی قافیە بەڕێوە دەچێ.

بەرهەمی شیعری نالی ئەوەی ئێستا لەبەردەستماندایە و ئاگاداریمان لێی هەیە لە زیاتر لە سەد پارچە غەزەل پێک هاتووە، هەندێ لەم غەزەلانە ئەوانەی ژمارەی دێڕەکانیان سێ یا شەش یا هەشت دێڕ بێ، بێ گومان ئەم شیعرانە ناتەواون، لەوانەشە هەندێ لەم غەزەلانە لە بنجدا قەسیدە بن و ژمارەی دێڕەکانیان لە دوازدە زیاتر بووبێ و بە درێژایی ڕۆژگار هەندێ لە دێڕەکانی کەوتبن.

١-قەسیدە: لەهەموو روویێکی ڕوخسارەوە وەکو غەزەل وایە، دەتوانین غەزەلی درێژی پێ بڵێین، بە ڕاستی ئەم بابەتە شیعرە غەزەلە، بەڵام کە ژمارەی دێڕەکانی زۆر بێ قەسیدەی پێ دەوترێ.

بەرهەمی نالی لەم جۆرە شیعرەدا کەمە، ژمارەی هەموو قەسیدەکانی لە ژمارەی پەنجەی هەردوو دەست تێناپەڕێ. لەمانە درێژترین قەسیدەی ئەو دوو (نەعت)ەیە کە بۆ پێغەمبەری وتووە، یەکەمیان (ئەی ساکینی...) لە ٦٨ دێڕە شیعر و دووەمیان (ئەلا ئەی نەفسی....) لە ٧٤ دێڕە شیعر پێک هاتووە. هەروەها دەتوانین لە قەسیدە بەناوبانگەکانی نالی ناوی قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم...) (٤٣ دێڕ) و (مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە...) (٤٩ دێڕ) ببەین.

٢-موستەزاد: جۆرە هونەرێکە لە غەزەل، شاعیر نیوە دێڕە شیعرێکی کورت دەخاتە سەر هەموو نیوە دێڕە شیعرە درێژەکان، لەبەر ئەوەیە موستەزادی پێ دەڵێن، واتە غەزەلێک شتی زیادی دەخرێتە سەر. نالی لەم جۆرە هونەرە تەنیا موستەزادێک لە دیوانیدا هەیە. بینای ئەندازیاری موستەزادەکە بەم جۆرەیە:

غەزەلەکە لە نۆ دێڕە شیعر پێک هاتووە، یەکێتیی کێش و قافیەی تێدایە. لە رووی کێشەوە لەسەر بەحری هەزەجی عەرووز ڕێک خراوە، قافیەی دەنگی (میم)ە (کەوتووم، چووم، مردووم.....هتد) هەرچی غەزەلەکەی دیکەیە ئەویش شیعرێکی نۆ دێڕە شیعرییە، بەڵام دێڕەکانی کورتن (مفعول- فعولن)، ئەممش لەسەر یەک کێش و یەک قافیەیە، قافیەی دەنگی (میم)ە (حەیاتم، وەفاتم، بەتەماتم... هتد) ئینجا دێڕە شیعرە درێژ و کورتەکان بەیەکترییەوە لکێندراون و بەسەر یەکەوە دەخوێنرێنەوە. بەم چەشنە موستەزادەکە دەتوانرێ بەسێ جۆر بخوێنرێتەوە. یەکەمیان هەمووی بەسەریەکەوە، دووەمیان دێڕە درێژەکان بەتەنیا، سێیەمیان دێڕە کورتەکان بە تەنیا. ئەم کارە دیارە وەستاییێکی پێویستە، شاعیری بە دەسەڵات نەبێ ناتوانێ ئەم بابەتە هونەرە کلاسیکییە بەبەرهەمی شیعری خۆی ببەخشێ.

موستەزادەکە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

**ئەی تازە جەوان پیرم و ئوفتادەو و کەوتووم**
**تاماوە حەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم**
**قوربانی وەفاتم**
**تۆ یووسفی نەو حوسنی لەسەر میسری جیھانی**
**من پیرم و فانی**
**لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردووم**
**هەر وا بەتەماتم**

٤-تاک (فەرد): بریتییە لە دێڕە شیعرێک (لە نیوەی دێڕی یەکەم و نیوەی دێڕی دووەم) پێک هاتووە، ئەم بابەتە شیعرە بۆ قسەیێکی نەستەق یا پەندێکی پێشینان یا بیرێکی فەلسەفی یا وێنەیێکی جوان بۆ ژن و دڵداری و وەسفی سروشت دادەنرێ.

نالی لەم جۆرە شیعرە تەنیا (تاک)ێکی هەیە:

**سەوتی نەغمەی بلبلە یا چەهچەهەی خرخاڵییە**
**دەنگی سۆلە یا لە ژێر پێی ناڵەناڵی (نالی)یە**

## تەرکیبی ناوەوەی شیعری نالی

شیعری نالی و هەموو شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی لە رووی ڕوخساری ناوەوەی ئەم ئەدکارانەی خوارەوەی هەیە:

١-دێڕە شیعری غەزەل یا قەسیدە دەکرێ بە دوو پارچە: یەکەمیان نیوە دێڕی یەکەم (سەدر) و دووەمیان نیوە دێڕی دووەم (عەجز)ی پێ دەووترێ.

٢-غەزەل یا قەسیدە یا هەر بابەتێکی تری شیعر لە رووی کێشەوە لە یەکەمین دێڕە شیعرەوە تا دوایی هەمووی لەسەر یەک کێش دەبێ، کێشەکان پێڕەوی عەرووز دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ بە پێوانەی سیلاب (کەرت) بکێشرێن بە تایبەتی ئەو شیعرانەی لەسەر کێشە سووکەکانی عەرووز دانراوون، وەکو ئاشکرایە لە شیعری کلاسیکی کوردی ئیسلامەویدا بە زۆری ئەو کێشە سووکانە بەکاردەهێنرێن، چونکە لەگەڵ زمانی کوردی دەگونجێن.

٣- هەندێ جار نالی دێڕی شیعر دەکا بە چوار کەرت، واتە هەر نیوە دێڕێ دەکا بە دوو کەرت، دوایی هەموو کەرتەکان وەستانیان تێدا دەبێ و لەسەر یەک قافیە دەبن. واتە نیوە دێڕی یەکەم دوو قافیەی دەبێ، وە نیوە دێڕی دووەمیش دوو قافیەی دەبێ، دوو قافیەکەی نیوە دێڕی یەکەم و قافیەی یەکەمی نیوە دێڕی دووەم لەسەر یەک کێش و یەک دەنگ (تیپ، حەرف) دەبن، وە قافیەی دووەمی نیوە دێڕی دووەم دەبێتە قافیەی بنچینەیی شیعرەکە، وەکو لەم غەزەلەی لای خوارەوە دەبینرێ:

**سۆفی چییە ئیشی تۆ هەر کایە حەشیشی تۆ**
**عاشق وەکو ڕیشی تۆ هەوساری لەکن پەشمە**
**چەند واسیعە ئەم زیهنە ئەفلاکی تێدا ڕەهنە**
**ئەجیالی لە لا عیهنە ئەدواری لەکن پەشمە**
**(نالی) کە قەدەح نۆشە مەستانە و سەرخۆشە**
**خامۆش نەمەد پۆشە ئەسعاری لەکن پەشمە**

بۆ دیارکردنی نرخی هونەری ئەم غەزەلە لە ڕووی ئاواز و ڕیتمەوە و کاریگەری بەسەر گوێی مۆسیقییەوە لە بابەت وێنەی بیناسازی دەرەوەی شیعرەکە دەتوانرێ بەم جۆرەش تۆمار بکرێ:

**سۆفی چییە ئیشی تۆ**
**هەر کایە حەشیشی تۆ**
**عاشق وەکو ڕیشی تۆ**
**هەوساری لەکن پەشمە**
**چەند واسیعە ئەم زیهنە**
**ئەفلاکی تێدا ڕەهنە**
**ئەجیالی لە لا عیهنە**
**ئەدواری لەکن پەشمە**
**(نالی) کە قەدەح نۆشە**
**مەستانەو و سەرخۆشە**
**خامۆش نەمەد پۆشە**
**ئەسعاری لەکن پەشمە**

٤-یەکێ لە ئەدگار و خاسیەتە هەرە گرنگەکانی شیعری نالی بەگشتی ئەوەیە هەر دێڕێکی لە مانادا سەربەخۆیە، واتە گیانی چیرۆکی و زنجیرەی بیری بەستراو بەیەکەوە کەمە، هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی شیعرەکانی پاش و پێش بخرێن. ئەگەر هەندێ دێڕە شیعر لە غەزەلێک یا قەسیدەیێکدا بکەون هەست بەبۆشایی جێگەی ناکرێ، بۆیە هەر دێڕە شیعرێک لە شیعری نالی دەشێ ببێ بە وتەیێکی جوان، یا قسەیێکی نەستەق، یا وێنەیەکی ڕەنگین. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ لە غەزەلەکانی نالی و بەتایبەتی لە قەسیدەکانیدا هەست بە زنجیرەی بیر واتە بەسەرهات و گێڕانەوەی ڕووداو دەکرێ. ڕووداوەکان زۆرن بەیەکتری دەبەسترێنەوە و حیکایەتێکیان لێ دروست دەبێ. واتە ئەم چیرۆکانە گیانی شیعریان تێدا هەیە.

٥- لە زۆربەی غەزەل و قەسیدەکانی نالی بە پێی دەستووری شیعری کلاسیکی لە دێڕی دواییدا نازناوی شاعیر تۆمار دەکرێ. بە زۆری ناوهێنانەکە لە دێڕی دوایی شیعرەکە دەبێ. ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێ لە هەموو دیوانی نالیدا تەنیا چەند غەزەل و قەسیدەیێک شاعیر نازناوی خۆی نەهێناوە. ئێمە وا بۆی دەچین ڕەنگە شاعیر لەم شیعرانەشدا نازناوی خۆی هێنا بێ، بەڵام ئەو دێڕە شیعرانە کەوتبن.

**کێشی شیعری نالی**

نالی پێڕەوی شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی کردووە لە ڕووی کێشەوە، هەموو شیعرەکانی بەبەحری عەرووزی کێشاوە، لەوانە بەشی هەرە زۆری غەزەلەکانی لەسەر کێشی هەزەج و هەندێ لەو کەمتر لەسەر کێشی ڕەمەلن. لە کێشی موزاریع هەشت غەزەلی هەیە، لە کێشەکانی ڕەجەز و بەسیت و تەویل لە هەریەکەیان غەزەلێکی هەیە.

لەناو قەسیدەکانی شاعیردا پێنجیان لەسەر کێشی هەزەجن، لە کێشی موزاریع و ڕەمەلدا لە هەریەکەیان دوو غەزەلی هەیە، تاکە قەسیدەیێکیش لە کێشی موجتەسە (مجتث)، موستەزادە تاقانەکەش لەسەر کێشی هەزەجە، هەرچی تاکە دێڕە شیعرییەکەی شاعیریشە لەسەر کێشی ڕەمەلە.

**قافیەی شیعری نالی**

غەزەل یا قەسیدە لە ڕووی قافیەوە، نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕی دووەمی دێڕی یەکەم لەگەڵ نیوە دێڕی دووەمی هەموو دێڕەکانی شیعر تا دوایی لەسەر یەک قافیە دەبن.

قافیە لە لای نالی و شاعیرانی دوای ئەو دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١-قافیەی سادە: ئەو ڕیزە وشانەیە کە تیپی (دەنگی) هەر دوایی، واتە یەک تیپ یا دوو، یان سێ، یان چوار، یان پێنج وەک یەک دەبن، بەمەرجێ ئەم تیپانە لە بزوێن و بێ دەنگ پێک هاتبن، ئەگەر لە شیعری نالی ورد ببینەوە دەبینین قافیەی وای هەیە تەنیا لەسەر یەک تیپ دامەزراوە، وەکو (ا)، (ۆ)، هی واشی هەیە لەسەر دوو تیپ، وەکو (شا)، (ار)، لەسەر سێ تیپ، وەکو (ادا)، (ارم)، لەسەر چوار تیپ، وەکو (ینتە)، (ــەندی)، لەسەر پێنج تیپ، وەکو (ایێکە)، (ایەوە).

٢-قافیەی قورس: هەندێ شیعری نالی قافیەیان بریتییە لە وشەیێک، یان ڕستەیێک، یان نیوە ڕستەیێک لە هەموو دێڕە شیعرەکاندا وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە، پێش ئەو قافیەیە قافیەیێکی دیکەی ئاسایی هەیە وەکو بڵێی ئەمە قافیەی یەکەمە، ئەوەی تر قافیەی دووەمە، یا دەتوانین (پاش قافیە)شی پێ بڵێین. بەم جۆرە قافیەی یەکەمی ئەم بابەتە شیعرانە وەکو قافیەی سادە وایە و لە هەموو شیعرێکی کلاسیکیدا هەیە وەکو لە پێشەوە باسمان لێوە کرد.

ئیتر دەکارین زاراوەی قافیەی قورس بۆ ئەم جۆرە شیعرە بەکار بینین. لای نالی ئەم جۆرە قافیەیە زۆرە، وەکو لای خوارەوە دەکەونە ڕوو:

(أ)قافیەی یەک وشەیی، وەک بەکارهێنانی ناو، وەکو (باز)، (کچ)، یان پاشکۆکانی ناو، وەکو (ئەز)، (من)، (قوربان)، یان فرمان، وەکو (دەکا)، (بوو)، (هەیە).

(ب)قافیەی ڕستە و ڕستەی ناتەواو، وەکو (ئەمشەو)، (نەبوو)، (لەکن)، (پەشمە)، (موجەررەد بێ)، (زولفەینی)، (دەوێ)، (نەما باس)، (نییە باس)، (دەخۆم)، (نادەم)، (بێ تۆ)، (بەعەبەس).

لەوانەیە بەرهەمی نالی لەمە زیاتر بوو بێ و ئەو بەرهەمەی لە دیوانی نالیدا چاپ کراوە ڕەنگە هەمووی نەبێ.

بەڵگە بە دەستەوە هەیە بۆ ئەم کەموکورییە:

١-شاعیرە کلاسیکەکانی قوتابخانەی ئیسلامەوی هەوڵیانداوە بەشی هەرە زۆری تیپەکانی (دەنگەکانی) ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بکەن بە قافیە، لەم ڕووەوە مەلای جزیری (١٥٦٧-١٦٤٠) لە پێش نالی و ئەحمەد حەمدی ساحێبقران (١٨٧٨-١٩٣٦) لە دوای نالیدا بەشی زۆری ئەو دەنگانەیان کردووە بە قافیەی شیعرەکانیان لەم لایەنەوە دەوڵەمەند بوون، بەڵام لە دیوانی نالیدا قافیەی هەندێ تیپی ئەلفبای کوردی و عەرەبی وەکو (پ، ح، خ، ذ، ش، ص، ض، ظ، ع، غ، ف، گ، ل) نابینرێن، ڕەنگە قافیەی ئەم هەموو دەنگانە یا هەندێکیانی هەبووبێ بەڵام ون بووبن.

٢-بەپێی دەستووری شیعری کلاسیکی کۆن زۆربەی شاعیران لە بابەت ناوەرۆکەوە شیعری موناجات (ئیلاهیياتیان) هەیە، تەنانەت دیوانەکانیان بەم جۆرە شیعرە دەکەنەوە، کەچی لای نالی دوو قەسیدەی نەعت (مەدح و ستایشی پێغەمبەر)ی هەیە، کەچی موناجاتی نییە. ڕەنگە بیرمان بۆ ئەوە بچێ لە نەعتەکانیدا هەست بەوە دەکرێ موناجاتی تیدا بێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ شاعیر شیعری موناجاتی نەوتبێ.

لەبابەت ڕووخساری شیعر و هونەرەکانی دیکەی شیعری کلاسیکییەوە نالی هەندێ لایەنی پشتگوێ خستووە و لە دیوانی شیعریدا تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و چوارین و هی دیکەش بەرچاو ناکەون. ئینجا ئەگەر لە دیوانی نالیدا تەنیا چوارینێکی فارسی هەبێ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ چوارینی بە زمانی کوردی هەبێ. ئێمە باس لە نالی دەکەین وەک شاعیرێکی کورد.

٣- دیوانی نالی سەرچاوەیێکی دەوڵەمەند و لەبارە بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنی ژیانی تایبەتیی خۆی لە نیشتماندا، کەچی ئەو دیوانە ناتوانێ تروسکاییێک بخاتە سەر ژیانی ئەم شاعیرە لە شام و ئەستەموڵ کە زۆر گرنگە بۆ ناسینی شاعیر. ئەو ماوە کەمەی لەو دوو جێیە ژیاوە لەوانەیە شیعری وتبێ بەڵام لەناوچوو بن، وەکو گەلێ لە شیعرەکانی حاجی و شاعیرانی کوردستانی باکوور، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیعرێکی کەمی حاجیمان پێ گەیشتووە لە ئەستەموڵ یادی کوردستانی کردۆتەوە.

---

سەرچاوە: کتێبی "مێژووی ئەدەبی کوردی - بەرگی سێیەم، د.مارف خەزنەدار" چاپی دووەم، دەزگای ئاراس ٢٠١٠.

